لە بڵاو کراوەکانی ماڵپەڕی بەهەشت

# ئامۆژگاری زێڕین

# بۆ

# خوشکانی سەنگین

ئامادەکاران


مامۆستا عدنان ، دایکی سونە ، پشتیوان حسن ، إدريس محمود ، باوکی فریشتە.


---


ماڵپەری بەهەشت

ba8.org


ماڵپەڕێکی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئەو ئیسلامەیە کە سەلەفی صالح - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێکی حیزبی نیە.

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر رێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە رەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاک بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

# خوشکی بەڕێزم

## ئایا دەزانی ئاکامی باڵانەپۆشینت یانی چی؟

بسم الله الرحمن الرحيم

خوشکی بەڕێزم : داواکارم ئەگەر بتوانی بە گوێی دڵ گوێبیستی ووتەکانم بیت ، و هەست و بیری خۆتم بدەیتێ ، لە چەند خولەکێکی ژیانت ، بۆ ئەوەی چەند ئامۆژگاریەکت بە گوێدا بدەم ، کە هەموویان ئامۆژگاری دڵسۆزن بۆ کەسێکی خۆشەویستی خۆی ، لە لایەن کەسێکی پەرۆش لە سەر دوا ڕۆژ و ژیانت ، لە ڕۆژگارێکدا کە ئامۆژگاریکاران تێدا کەم و بەدەگمەنن ، ئامۆژگاریەکانیشم بە شێوەی پرسیار دەبن ، بۆ ئەوەی هەموو پرسیارێکی زەنگێکی بیدارکاری بێت ، و چیتر لە خەوی غەفڵەت بێدارت بکاتەوە ، و بە ئاگا بیت ، و قۆڵی خواناسانەی بۆ هەڵماڵیت و پەشیمان ببیتەوە لەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کەمتەرخەمیەکت نوواندبێت لە باڵا پۆشیتدا ، کە نیشانی بڕواداری حیشمەت و جوانی تۆیە لە دونیای کۆتای هاتوو ، هۆکاری ڕزگار بوونی هەتا هەتاییتە لە ئاگری دۆزەخ ، ئەو دۆزەخەی کە خوای پەروەردگار لە وەسفیدا فەرموویەتی :

﴿ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾ ( سورة البقرة : ٢٤ ) ، واتە : لەو ئاگرە بترسن کە سووتەمەنیەکەی خەڵك و بەردە ، خوای پەروەردگار پەنای من و تۆش بدات لەوەی کە خۆمان بە دەستی خۆمان بۆ دونیا و خۆشیەکی کاتی بکەین بە سووتەمەنی ئەو ئاگرە ، بۆیە داواکارم ئەگەر تا ئەمڕۆش کەمتەرخەمیەکت لە بالاّپۆشەکەتدا کردبێت ، دوای بیستنی ئەم ووتانە بڕیاری یەك لای خۆت بدەیت و بالاّپۆشیەکەت بە باشترین شێوە و بەو مەرجانەی کە پێویستە لە بالاّ پۆشەکەتدا هەبێت ئەنجام بدەیت ، و سەردەمی سستی و تەمبەڵی بەلاوە بنەیت ، بزانی کە مانەوەت لە دونیادا کاتی و کەمە ، بەڵکو هەر زۆر کەمە ، و سەردەمی لاوێتی دەڕوات و نامێنێت ، و جوانیەکەشت بەهەمان شێوە لە ناو دەچێت و نامێنێت ، و گەشی و درەوشاوەیی لە ناو دەچێت ، ئەوەش : بە مردنێکی نزیك و خێرا ، یان بە پیریەك کە لە ڕێگەی هەمووانە و دێت ، و بە هیچ شێوەیەك دەرچوون نیە لە دەستی ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴾ ( سورة البقرة : ٢٨١ ) ، واتە : خۆتان بپارێزن لەو ڕۆژەی کە دەگەڕێنەوە تیایدا بۆ لای خوای پەروەردگار ، پاشان هەموو کەسێك پاداشت دەدرێتەوە لەو

کردارانەی کە ئەنجامی داون ، و دڵنیاش بن کە کەس لەو ڕۆژەدا ستەمی لێ ناکرێت .

## ئەمەش ئامۆژگاریەکانن :

✍ ئایا دەزانی بالآنەپۆشینت سەرپێچی کردن و شکاندنی فەرمان و وتەی پەروەردگارتە کە فەرمانی پێکردوویت : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ... ﴾ ( سورة الأحزاب : ٥٩ ) ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزان و کچەکانت و ئافرەتی بڕواداران بڵێ با بالآ پۆشەکانیان بدەن بە خۆیاندا .

وە هەروەکو فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى ﴾ ( سورة الأحزاب : ٣٣ ) ، واتە : لەکاتی دەرچوونتاندا خۆتان ڕووت مەکەنەوە ، هەروەك چۆن ئافرەتان لە سەردەمی نەفامیدا خۆیان ڕووت دەکردەوە .

✍ وە ئایا دەزانیت ئەو کارەت هۆکاری ئازاردنی خۆتە ، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ ( سورة الأحزاب : ٥٩ ) ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێزان و کچەکانت و ئافرەتی بڕواداران بڵێ با بالآ پۆشەکانیان بدەن بە خۆیاندا ،

ئەوەش نزیك ترە بۆ ئەوەی کە بە ڕەوشت بەرز و بە حەیا و حیشمت بناسرێنەوە ، و ئەزیەت و ئازار نەدرێن ، پەروەردگاری تۆش لێبووردە و میهرەبانە .

✍ وە ئایا دەزانیت بەو کارەت چاوی گورگە برسیەکان ، و کەسانی دڵ نەخۆش تێر دەکەیت ، و دەبیتە هۆی ئەوەی سەدان لەو گورگانە تەماحت تێ بکەن ؟! هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ﴾ ( سورة الأحزاب : ٣٢) ، واتە : پێویستە لە سەرتان لە هەموو ڕێگەیەکی حەرام و قەدەغەکرا و خۆتان بپارێزن ، لەوانەش قسە نەکردنە بە نازەوە لە گەڵ پیاوانی نامەحرەمدا ، بۆ ئەوەی کەسانی دەروون نەخۆش تەماحتان تێنەکەن ، و وتەشتان با ووتەیەکی ئاسایی بێت ، ئەمە ئەگەر ووتەکانت ئەوەندە کاریگەر بن ، ئەی ئەبێت باڵا نەپۆشینت چۆن بێت ؟!! جا ئاممان نەکەی خوشکەکەم خۆت بکەیتە جێی تەماحی گورگە برسیەکانی ئەم ڕۆژگارە .

✍ وە ئایا دەزانیت کە باڵا نەپۆشینت پێچەوانە بوونەوەی ووتەی پێغەمبەرەی خوایە ﷺ ، و ڕازیکردن و شوێنکەوتەی ووتەی شەیتانەکانی جنۆکە و مرۆڤە ؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لم يصلح أن يرى منها شيء إلا هذا وهذا – وأشار

إلى وجهه وكفيه " ( حسنه الألباني في صحيح الجامع ، برقم : ٧٨٧٤ ) ، **واتە : ئەی ئەسما ئەگەر ئافرەتی موسڵمان گەشتە تەمەنی باڵغ بوون نابێت جگە لە دەستەکان و ڕوومەتی زیاتر دەرکەوێت .**

**وە خوای پەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوە کە شەیتان لە گەڵ باوکە ئادەم و دایکە حەوادا چی کردووە ، کە فەرموویەتی :** ﴿ ... فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا ... ﴾ ( سورة طه : ١٢١ ) ، **واتە : بە هۆی ئەو تاوانەی کە پێ ی کردن ، عەورەتیان دەرکەوت .**

✍ **وە ئایا دەزانیت بەو کارەت خۆت بە ئەهلی دۆزەخ دادەنەیت ، و خۆت دەخەیتە ڕیزی دۆزەخیانەوە ، خوای پەروەردگار پارێزەرت بێت لە ئاگری دۆزەخ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** " صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا ... وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ ... " ( رواه مسلم ) ، **واتە : دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون ... کۆمەڵێکیان ئافرەتانێکن داپۆشراون بەناو لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجەولار دەڕۆن بەڕێوە ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەکێشن ، و پرچیان بە شێوەیەك بە سەر سەریانەوە دەبەستن وەکو بان پشتی ووشتر وایە ... وە زانایان فەرمویانە : مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئافرەتانەیە کە جل و بەرگی ناسك دەکەنە بەر ئەو جۆرە پۆشاکانە لە**

ڕاستیدا لەشیان دەردەخات ، نەك ئەوەی کە دایان بپۆشێت ، ئەو جۆرە ئافرەتانە بە ناو داپۆشراون ، کەچی لە ڕاستیدا ڕووتن . ( جلباب المرأة المسلمة : ١٢٧ )

✍ وە ئایا دەزانیت بەبالاً نەپۆشینت خۆت بێ بەش دەکەی لە بەهەشتی بەرینی خوای پەروەردگار ، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بەوە داوە و فەرموویەتی :

" صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا ... وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا " ( رواه مسلم ) .

واتە : دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون ... کۆمەڵێکیان ئافرەتێلێکن داپۆشراون بەناو لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجەولار دەڕۆنە ڕێوە ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەکێشن ، و پرچیان بە شێوەیەك بە سەر سەریانەوە دەبەستن وەکو بان پشتی ووشتر وایە ، ئەوانە ناڕۆنە بەهەشتەوە ئەگەر چی بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەشەوە دەبیسترێت .

✍ وه ئایا دەزانیت بەو كردارەت تاوانی ئەو كەسانەش دەخەیتە ئەستۆە خۆت كە تۆ لە خشتەیان دەبیت ، و دەیانخەیتە تاوانەوە ، خوای پەروەردگار فەرمویەتی : ﴿ لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلاَ سَاء مَا يَزِرُونَ ﴾ ( سورة النحل : ٢٥ ) .

واتە : لە ڕۆژی دواییدا تاوانباران تاوانی خۆیان بە تەواوی هەڵدەگرن ، لە گەڵ تاوانی ئەوانەی كە گومڕایان دەكەن بە بێ زانین ، بەڕاستی ئەوە تاوانبارییەكی زۆر خراپە .

✍ وه ئایا دەزانیت بەو كارەت خۆت دەخەیتە ڕیزی دوو ڕووانەوە . خوای پەروەردگار پەنادەرت بێت لەو كارە . هەروەكو لە فەرموودەدا هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " وشر نسائكم المتبرجات المتخيلات ، وهن المنافقات ، لا يدخل الجنة منهن إلا مثل الغراب الأعصم " ( صححه العلامة الألباني في : الصحيحة ، برقم : ١٨٤٩ ) ، واتە : خراپترینی ئافرەتەكانتان ئەو ئافرەتانەن كە جوانیەكانی خۆیان دەردەخەن ، و خۆ دەڕازێننەوە ، و لە خۆ ڕازین و فیز و تەكەبور دەكەن بە سەر ئافرەتانی تردا ، بەڕاستی ئەوانە خۆ دەشوبهێنن بە دوو ڕووان ، هیچ یەكێك لەوانە ناڕواتە بەهەشتەوە ، ئیللا وەكو قەڵە بازەڵە نەبێت ( كە جۆرێكە لە قەڵە ڕەش باڵەكانی یان پێكانی سپین) ، هێنانەوەی ئەم شێوەیە لە قەڵە ڕەش

به نموونه به هۆی کەمیانەوەیە ، بۆ ئاماژە کردنە بە کەمی ئەو ئافرەتانەی کە دەڕۆنە بەهەشتەوە ، ئەگەر بالاّ پۆش نەبن .

لە کۆتایدا پێت دەڵێم ئەگەر تاکو ئەمڕۆ نەتزانیبێت ، ئەوا ئەمڕۆ ئەو تاوانەت لا ئاشکرا بوو ، بەڵام نائومێدیش مەبە لە ڕەحمەتی خوای میهرەبان ئەگەر تۆبەیەکی ڕاستەقینەت کرد و گەڕایتەوە بۆ لای ئەو ، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ ( سورة الزمر : ٥٣ ) ، واتە : بڵێ بەو بەندانەی کە زیادڕەویان کردووە لە تاوان کردندا ، بێ ئومێد و مەئیووس نەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگار ، چونکە خوای پەروەردگار لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت ، هەر ئەویشە لێبوردە ، و بە بەزەیی یە بەرامبەر بە بەندەکانی .

جا خوشکی بەڕێزم : بیرێك لەم ووتانە بکەرەوە ، وبڕیار بدە کە ئایا دوای بیستنی ئەم ووتانە هێشتا هەر بەردەوام دەبیت لە سەر بالاّ نەپۆشینت ، وهێشتا دڵت ڕانەچەڵەکیوە ؟! یان چی ؟!

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**مامۆستا عدنان بارام**

# هەردوو ئافرەتن بەڵام !!!

## پلەیان لە لای پەروەردگار جیاوازە

( بەشی یەکەم )

## ﴿ ئەو ئافرەتەی کە پەروەردگار خۆشی دەوێت ﴾

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ... أَمَّا بَعْدُ :

**خوشکی موسڵمانم ئەمانەی خوارەوە چەند جۆرە ئافرەتێکن کە هەندێك سیفەت و ئاکاریان تێدایە ، بەهۆیانەوە خوای بەرز و بڵند خۆشیانی دەوێت و لێیان ڕازییە ، ئەوەش لە ژێر ڕووناکی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەهیوای ئەوەی کە خوشکانمان لەخۆیاندا بەرجەستەی بکەن بۆ ئەوەی ببن بە خۆشەویستی پەروەردگاریان ، ئەوانەش :**

❑ **ئافرەتی خۆپارێز و لەخوا ترس ( المرأة التقية ) : خوای بڵند و بالادەست فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴾ ( آل عمران : ٧٦ ) ، واتە : بەڕاستی خوای پەروەردگار کەسانی لە خواترسی خۆشدەوێت .**

له خوا ترسیش ئەوەیە کە ( طلق ) ی کوڕی ( حبیب ) فەرموویەتی : " العمل بطاعة الله ، على نور من الله ، رجاء ثواب الله ، والحذر من معصية الله ، على نورٍ من الله ، مخافة عقاب الله " ، واتە : گوێڕایەڵی کردنە بۆ پەروەردگار ، لە سەر ڕووناکیەك کە لەلای خواوە هاتبێت ، بە ئومێدی پاداشت لەخواوە ، وە وریا و بەئاگابوونە لە سەرپێچی خوای پەروەردگار ، لە سەر ڕووناکیەك کە لەلای خواوە هاتبێت ، لە ترسی سزای خواوە .

❑ **ئافرەتی خۆپاکڕاگر لە ڕووکەش و دەروونـدا ( المرأة النقية ) :** خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ ( البقرة : ٢٢٢ ) ، واتە : خوای پەروەردگار کەسانی تۆبەکار و خۆپاکڕاگرانی خۆش دەوێت .

وە ئەو پاکڕاگریەش پێش هەموو شتێ پاکڕاگرتنی دەروونە لە غەش و حەسوودی و خۆ بەزلزانین و غرور و بەرزبونەوە لە زەویدا ، پاشان و دوای ئەوە پاکێتی جەستەیە ، چونکە خوای باڵادەست جوانە و جوانیشی خۆشدەوێت .

❑ **ئافرەتی تۆبەکار ( المرأة التائبة ) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ ( البقرة : ٢٢٢ ) ،

واتە : بە ڕاستی خوای پەروەردگار ئەو كەسانەی خۆش دەوێت كە تەوبە دەكەن و دەگەڕێنەوە بۆلای و هەروەها ئەو كەسانەش كە پاكن .

تەوبەش گەڕانەوەیە لەوەی كەخوای گەورە پێی ناخۆشە بۆ ئەوەی كە پێی خۆشە ، ئەمەش یەكێكە لە بەرزترین پلە و پایەكانی مرۆڤ كە پێویستی پێیەتی لە ڕێڕەوی بۆلای خوا ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ( النور : ٣١ ) ، واتە : ئەی ئیمان داران هەمووتان تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا ، بەڵكو سەرفراز بن .

❑ **ئافرەتی دادوەر ( المرأة المقسطة )** : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴾ ( الحجرات : ٩ ) ، واتە : دادوەر بن چونكە بەڕاستی خوای پەروەردگار دادوەرانی خۆش ئەوێت .

( قسط ) یش ، واتە : عەدالەت و دادوەریێتی ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " إن المقسطين عند الله على منابر من نور : الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وما ولُوا " ( رواه مسلم ) ، واتە : دادوەران لەلای خودا لەسەر مینبەری نوورینن ، ئەوانەی كە دادوەرن لە حوكمەكانیاندا و لە كەس و كار و ژێر دەستەكانیان .

❑ **ئافرەتی شوێنکەوتوو نەك بیدعەكار ( امرأة متبعة غير مبتدعة )** : خـوای بالادەسـت فەرموویـەتی : ﴿ قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ ( آل عمران : ٣١ ) ، واتـە : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێیـان بڵـێ : ئەگـەر ئێـوە ڕاست دەكـەن خواتـان خـۆش دەوێـت ، دەسـا شـوێن مـن بكـەون ، ئـەو كاتـە خـوای پەروەردگار خۆشتانی دەوێت و لەتاوانەكانتان خۆش دەبێت .

وە پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : "كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى !! قيل : ومن يأبى يا رسول الله ؟! قال : من أطاعني دخل الجنة ، ومن عصاني فقد أبى " ( رواه البخاري ) ، واتە : هەموو ئوممەتی من دەچێتە بەهەشتەوە ئیلا ئـەو كەسە نەبێت كە خۆی نەیەوێت !! ووتیان : كێ نایەوێت ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ؟!! ئـەویش فـەرمووی : هـەر كەسـێك گوێڕایـەڵیم بكـات ئەچێتە بەهەشتەوە ، هەركەسێك سەرپێچیم بكات ئەوە خۆی نەیویستووە .

❑ **ئـافرەتی چـاكەكار ( المـرأة المحسـنة )** : خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ ( المائدة : ١٣ ) ، واتـە : لێیـان خۆشـبە و چـاو پۆشـیان لـێ بكـە چونكە بەڕاسـتی خـوای گەورە چاكەكارانی خۆش دەوێت .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٣٤ ) ، واتە : ئەوانەی کە تووڕەیی و ڕقی خۆیان دەخۆنەوە و قوت دەدەن و لە خەڵکی خۆش دەبن ، و خوای گەورەش چاکەکارانی خۆش دەوێت .

( الإحسان ) یش واتە : چاکە کار : ووتەیەکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو کردارێکی جوان و ووتەیەکی چاك و هەڵویستێکی ژیرانەیە .

❑ **ئافرەتی خۆبەکەمزان ( المرأة المتواضعة )** : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴾ ( المائدة : ٥٤ ) ، واتە : خوای پەروەردگار کەسانێك دەهێنێت کە خۆشیانی دەوێت و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت هەروەها ملکەچ و بە سۆزن بەرامبەر ئیمان داران و سەر بڵند و دەرون بەرزن بەرامبەر بێباوەڕان .

( تواضع ) یش خۆ بە کەم زانین ناونیشانی بەرزبوونەوەیە لە دونیا و دوا ڕۆژدا ، و هەر بۆ ئەمە یە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " وما تواضع أحدٌ لله إلا رفعه الله " ( رواه مسلم ) ، واتە : هیچ یەکێك لە بەر خوا خۆی بە کەم نازانیٚ ئیللا خوای پەروەردگار بەرزی دەکاتەوە .

❑ **ئــافرەتی ئــارامگر ( المــرأة الصــابرة ) : خـوای پـەروەردگار فەرمووویـەتی :** ﴿ وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٤٦ ) ، **واتـە : خـوای پەروەردگاریش ئارامگر و خۆ ڕاگرانەی خۆش دەوێت .**

**پێغەمبـەری خـواش** ﷺ **فەرمووویـەتی :** " عجباً لأمر المؤمن إن أمره كله له خير و ليس ذلك لأحد إلا للمؤمن : إن أصابته سراء شكر فكان خيراً له ، و إن أصابته ضراء صبر فكان خيراً لهُ " ( رواه مسلم ) ، **واتـە : کـار و کـرداری کەسـی ئیماندار جێی سەر سامییە ، بەڕاستی هەموو کار و باری بە گشتی بۆی بە خێر و چاکە دەنووسرێت ، ئەمـەش بۆ هـیچ یـەکێك نیـە جگـە لـە ئیمـان دار نەبێت : ئەگەر خۆشی یەکی توش بیٚ شوکری خـوای تیـا دەکـات ئـەوا بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت ، وە ئەگـەر ناخۆشیەکی تـوش بێـت ئـەوا ئارام دەگرێت هەر دەبێت بە خێر و چاکە بۆی .**

❑ **ئافرەتی متمانەکــار و پشتبەستو بـە خــوا ( المـرأة المتوكلـة على الله ) : خـوای پـەروەردگار فەرمووویـەتی :** ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ ( آل عمران : ١٥٩ ) ، **واتە : بە ڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کەپشتی پیٚ دەبەستن .**

**لە کۆتـاییـدا دەڵـێم : نـازانم ئـاخۆ خوشـکەکەم بـەش و نسیبی تـۆ لـەم سیفەت و ئاکارانە چیە ؟!**

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**دایکی سونە**

# هەردوو ئافرەتن بەڵام !!!

## پلەیان لە لای پەروەردگار جیاوازە

### ( بەشی دووەم )

## ﴿ ئەو ئافرەتەی کە پەروەردگار ڕقی لێیە ﴾

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ... أَمَّا بَعْدُ :

ئەمەش هەندێك جۆری ئافرەتە كە هەندێك سیفەت و ئاكاریان تێدایە ، بەهۆیانەوە خوای گەورە خۆشی ناوێن و ڕقی لێیانە ، ئەوەش لە ژێر ڕووناكی قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، داوامان وایە لە خوای پەروەردگار كە ئافرەتەكانمان دوور بخاتەوە لە هاوشێوەی ئەمانە ، و ئیستیقامەیان لە هەڵسوكەوت و ڕەوشتدا پێ كەرەم كات ، ئەوانەش :

❑ **ئـــافرەتی بـــێ بـــاوەڕ ( المــرأة الكـــافرة )** : خـوای گـەورە فەرمووویــەتی : ﴿ فَـإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِـبُّ الْكَـافِرِينَ ﴾ ( آل عمـران : ٣٢ ) . واتـــە : دڵنیا بن کە خوای گەورە بێباوەڕانی خۆش ناوێت .

هەروەها ئەوەش بێ باوەڕییە کە : پێغەمبەری خوا ﷺ یان هەندێك لـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێناویـەتی بـەدرۆ بزانرێـت ، یـان ڕق لێبوونی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، یان ڕق لێبوونی لـە هەنـدێك لـەوەی کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێناویـەتی ، یـان پشـت هـەڵکردن لـە ئاینەکـەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یان گومان بوون لـە پێغەمبـەری خوا ﷺ ، یان لـە هەندێك لەوەی کـە پیغەمبـەری خـوا ﷺ هێناویـەتی یان باوەڕ نـەبوون بە فەرزێتی نوێژ و جگە لەمانەش .

❑ **ئـافرەتی خراپـەکار ( المـرأة المفســدة )** : خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ﴾ ( المائدة : ٦٤ ) ، واتــە : هــەوڵی ئـــەوە دەدەن کـــە فـــەســـاد لـــە ســـەر زەوی دا بڵاوبکەنــەوە ، خـــوای گـــەورە مـــوفسیدینی خۆش نـاوێ بەڵکو زۆر ڕقی لێیانە .

وە لەو شتاتەش کە فەساد و خراپەن : ڕووتی و دەرکەوتنی سفورێتی ئافرەت ، یان بانگەواز کردن بۆ ئەم کارە و پشت گوێ خستن و واز هێنان لە بەها ئیسلامییەکان .

وە یەکێکی تر لە فەساد و خراپەکان تەنها بوونەوەی ئافرەتانە لەگەڵ پیاواندا وە تێکەڵ بوونیان بە پیاوانی بێگانە ، و هەروەها ئەوەی کە ئافرەتان خۆیان بە پیاوان دەشوبهێنن ، یان بە ئافرەتانی بێ باوەڕ و جگە لەمانە .

❑ **ئافرەتی ستەمکار ( المرأة الظالمة ) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴾ ( الشورى : ٤٠ ) ، واتە : ئەوەی کە لێ بووردە و چاك ساز بوو پاداشتی لای پەروەدگاری خۆیەتی خوای پەروەردگاریش ستەم کارانی خوش ناوێت

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " اتقوا الظلم ، فإن الظلم ظلمات يوم قيام " ( رواه مسلم ) ، واتە : خۆتان لە ستەم بپارێزن ، چونکە ستەم تاریکییە لە ڕۆژی دوایدا .

وە هەروەها فەرموویەتی :" إن الله ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته" ( متفق عليه ) ، واتە : پەروەردگار ڕێدەدات بە ستەمكار و دوای دەخات تاكو كاتێك كە لە ناویدا بە هیچ شێوەیەك ڕزگاری نابێت .

❑ **ئافرەتی دەست درێژیكار ( المرأة المعتدية )** : خوای بڵند و باڵادەست فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ ( البقرة : ١٩٠ ) ، واتە : نەكەن دەست درێژی بكەن ، چونكە بە ڕاستی خوای پەروەردگار دەست درێژ كارانی خۆش ناوێت .

هەر لە دەست درێژ كردنە : جوێن دان بە خەڵكی و ستەم لێ كردنیان و ئازار دانی هاوسێ و جگە لەمانە .

❑ **ئافرەتی خۆبەزلزان ( المرأة المتكبرة )** : خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴾ ( النساء : ٣٦) ، واتە : بە ڕاستی خوای پەروەردگار ئەوانەی خۆشیانی ناوێت كە خۆیان بە زل ئەزانن و فەخر بە سەر خەڵكدا دەكەن .

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " ألا أخبركم بأهل النار ؟كل عتل جواظ مستكبر " ( متفق عليه ) ، واتە : ئایا پێتان ڕابگەیەنم كە ئەهلی دۆزەخ كێن ؟ هەموو كەسانی وشك و توند و ڕەق لە گەڵ كەسانێك كە لە

ڕێکردندا فیز دەکەن و ئەگەر پارە و پولیان دەست کەوێ دەیگرنەوە لە خەڵکی .

❑ **ئافرەتی خیانەتکار ( المرأة الخائنة ) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴾ ( النساء : ١٠٧ ) ، واتە : بە ڕاستی خوای باڵادەست ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خیانەتکار وتاوان بارن .

وە لەو شتانەش کە بە خیانەت دەژمێردرێن : پشت هەڵکردن لە ئەحکامەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە خیانەت کردن لە ڕاسپاردە ، و خیانەت کردن لە مێرد ، وە هەروەها لە هاوڕێ ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ( الأنفال : ٢٧ ) ، واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خیانەت مەکەن لە خوا و لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، و هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و ڕاسپاردەکان کە پێتان دەسپێردرێت لە کاتێکدا کە خۆتان دەزانن ئەو کارە هەڵەیە .

❑ **ئافرەتی بەدمەسرەف و زیادڕەویار ( المرأة المسرفة ) :** خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ

**الْمُسْرِفِينَ ﴾ ( الأعراف : ٣١ ) ، واتە : بخۆن و بخۆنەوە بەڵام زیادەڕەوی و بەدمەسرەفی مەکەن چونکە بە ڕاستی خوای پەروەردگار زیادەڕەویکار و بەدمەسرەفی خۆش ناوێت .**

**هەروەها فەرموویەتی :** ﴿ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا ﴾ ( الإسراء ٢٦ ـ ٢٧ ) ، **واتە : ماڵ و سامان بە فیڕۆ مەدەن چونکە بە ڕاستی ئەوانەی ماڵ و سامانیان بە فیڕۆ دەدەن ئەوانە برای شەیتانەکانن ، شەیتانیش لە بەرامبەر پەروەردگاریدا زۆر ناشوکر و بەدنمەکە .**

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** " ما ملأ ابن آدم وعاءً شراً من بطنه ، بحسب ابن آدم لقيمات يقمن صلبه ، فإن كان لا محالة ، فثلث لطعامه وثلث لشرابه ، وثلث لنفسه " ( رواه أحمد و الترمذي و صححه الألباني ) ، **واتە : نەوەکانی ئادەم هیچ شتێکیان پڕنەکردوە خراپتر بێت لە سکیان ، چونکە مرۆڤ چەند پارویەکی بەسە کە پشتی پێ ڕاست بکاتەوە ، بەڵام ئەگەر هەر پێویست بوو ئەوا با سێیەکێکی بۆ خواردن ، و سێیەکێکی تری بۆ خواردنەوە ، و سێیەکەکەی تری بۆ هەناسەدان .**

**لـــە کۆتـاییـــدا : داواکـارم لـە پـەروەردگاری میهرەبـان مـن و هـەموو خوشکانی موسڵمانم لەم سیفەت و ئاکارە خراپ و قێزەونانە بپارێزێت و بەدورگرێت ... ئامین .**

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**دایکی سونە**

# نامەیەك بۆ ئافرەتێکی غەریب

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ تۆیە نووسینەکەم ... ئەی ئەو ئافرەتەی کە دەستت گرتووە بە حیشمەتی ڕاستەقینەوە ... ئەی ئەو کەسەی کە پێچەت کردووە بە داپۆشەری ڕوومەت ... و بالاپۆشێك ( عابایەك ) ی فراوانیشت لە خۆ پێچاوە ... و دەستکێشە ڕەشەکانیشت لە دەست کردوون ، هەموو ئەوانە وەکو حیشمەت و دینداریەك ، نەك وەکو عادەت و کەلە پووری باو باپیرانت ، یان بەنیازی فیتنە و لە خشتەبردنی گەنجان !!

خوشکی خۆم ...ئەی درووشمی شەرفداریمان ... ئەی جێگەی پارێزگاری لە ناموسمان ... دەست بگرە بە حیشمەت ... و حیجابە شەرعیەکەتەوە لە سەردەمی غەریبیدا ، نەکەی لە بەر توندی تاقیکردنەوەکان تووشی دڵە ڕاوکێ و دوو دڵی بیت و دوا بکەویت لە کاروانی حشیمەت دارێتی ، یان بە هۆی زۆری ئاشووب و فیتنەکانەوە .

نەکەی زۆری ئەوانەی کە دەیانبینیت مەلاسەیان دێت بەدوای هەموو بێ نرخێکدا ، لاوازت بکات لە ڕێگەکەت ، چونکە تۆی بە نرختر و بڵندتر لە هەموان .

تۆ ووشك و ئاڵۆز ( معقدة ) نیت ... تۆ دواکەوتوو نیت ... تۆ بێ نرخ نیت ... چەندەها کەسی پاك و پابەند بوو بە ئایین ئاواتی ئەوەیە کە تۆ ببیت بە هاوسەری ... چونکە متمانەی پێتە لە کاتی دەرچوونی ، و گران بەهاترین شتی ژیانی دەخاتە ژێر دەستەکانت .

باشیش بزانە کە چەندەها کەسی بێ ئابڕو و درۆزن ( مستهتر ) هەن تەماشای ئەو ئافرەتە بێ نرخانە ناکەن جگە بۆ ئەوە نەبێت کە وەکو ( بوکە شووشەیەکی کاتی ...و بۆ کاتێکی دیاریکراو ) نەبێت.

ئەی دارایی بە نرخی ئێمە ... ئەی شوێنی پارێزەری حیشمەت و حەیا ... ئەی مرواری گران بەها لە ڕۆژگاری سەرگەردانی و لە ناوچووندا ... ئەی دروشمی حیشمەت و حەیا ، غەریبی خۆت بە نامۆ و خراپ مەزانە ، چونکە غەریبی تۆ چاکەیەکە ، تاکو لە خواوە نزیك بیتەوە ئەو غەریبیە کەم دەبێتەوە ، بەڵام غەریبی خراپەکاران خراپە و ناقۆڵایە ... هەرگیز ئەوەت بە خەیاڵدا نەیەت کە ئەو جۆرە ئافرەتە خراپ و بێ نرخانە دڵ خۆش و خۆش بەخت بن ، لە کوێوە خۆشبەختی بۆ دێت خۆی باش دەزانێت گەورەترین ئاواتی پیاوان پێی ئەویە کە بیکەن ( عاشق ، و شەیدا ) ی خۆیان !! جا بزانە ئەو جۆرە ئافرەتانە لە چ دڵە ڕوکێیەك دەژین ؟!!

ئەی خوشکی بەحەیاو بە حیشمەتمان ... نابێت دڵی ئافرەتان پێشتر بکرێتەوە بۆ کەسێکی تر جگە لە مێردەکانیان نەبێت ، ئەوەش بۆ ئەوەی بتوانێت بە شادومانی و بەختەوەری خۆش بەختیەوە لە گەڵیا بژێت ، و هیچ یادگاریەکی ڕابردوو ژیانی لێ تاڵ نەکات ، و وێنە و ڕەنگەکانیش لە بیری خۆیدا تێکەڵ نەکات ، کەم جاریش دەبینیت ئەو ئافرەتانەی کە لە سەرەتای ژیانیان بە ئاشقێتی دەست پێ کردووە ، دەتوانن لە خۆشەویستیەکی پاکدا بژین لە گەڵ مێردەکانیان .

بە ئاگا بە و دوور بکەوە لەو ئافرەتانەی کە بانگەشەکارن بۆ خراپە و خراپەکاری ، ئەوانەی کە گران بەهاترین شتیان لە دەست داوە کە هەموو ئافرەتان هەیانە ، وە ووتەکەی پێشەوا ( عثمان ) ت لە پێش چاو بێت کە فەرموویەتی : ( وَدَّت الزانيةُ لو أنَّ النساءَ كُلُّهنَّ زواني ) ، واتە : ئافرەتی داوین پیس پێی خۆشە هەموو ئافرەتێك وەکو ئەو داوێن پیس بن .

بۆیە خوشکی بە حیشمەت و حەیامان ئەو جۆرە ئافرەتانە حەسادەدت پێ دەبەن ...بۆیە نەکەی لەغاوی خۆتیان بدیە دەست!!

خوشکی بە حیشمەت و حەیامان بە ئاگا بە ... لە سەنگەری تۆوە هێرش بکرێتە سەر ... ئاینەکەت ... کەس و کارت ... کۆمەڵگاکەت ... خۆت بپارێزە بۆ ئەوەی ئەوانە هەموو بپارێزیت ، لە ناویان نەبەیت .

حیجابەکەت ... حیشمەت و حەیاکەت ... گەوهەرەی بە نرخی تۆن ... نەکەی کەم تەرخەمیان تیادا بکەی .

هۆکارەکانی ڕووخاندنی کەسایەتی تۆ زۆرن ... لە هەموو لایەکەوە دەوریان لێ داویت ... جا بە ئاگابە ، و چاوکراوە بە .

ئاگادار بە ... بانگەشەکارانی خراپەکاری لە ڕێگەی تۆوە لە ناومان نەبەن ... و خەنجەری خیانەت کاریمان لە پشتەوە لێ نەدەن لە ڕێگەی تۆوە ... بە ئاگابە لە ناونەچیت ... چونکە لە ناوچوونی تۆ لە ناوچوونی ئوممەتێکە .

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**نووسینی : شێخ سالم العجمی**

**وەرگێڕانی : مامۆستا عدنان بارام**

# عابایە یان ئامرازی ڕازاندنەوەیە؟؟!

بسم الله الرحمن الرحيم

خوشکەکەم ... داواکارم ئەم پەڕەیە بەوپەڕی ڕاستیەوە لە گەڵ خۆدا بخوێنیتەوە ...

عابای سەرشان !!! ئایا بۆ پۆشتەییە یان ئامرازی خۆڕازاندنەوەیە !!؟

ئایا گومانت وایە بە پۆشینی ئەو جۆرە عابایە خۆداپۆشینی پێویستت بە دی هێناوە کە لێت داواکراوە ؟

ڕاشکاوبە لە گەڵ خۆتدا ... ئایا ئەم عابایەی کە لە ( کریب ) دروست کراوە ، کە پارچەیەکی درەوشاوەیە ، و بە شێوەیەك دەلکێت بە لەشەوە هەموو بەشەکانی دەردەخات ، و قەبارەی دەکات ، تاکو بووەتە دیاریدەیەکی ئاشکرا بۆ ڕووتی وسفووری !

بە خۆت پێمەکەنە ... بەوەی کە بڵێت : عابای ئیسلامیە !!! چونکە ناوەکان هیچ لە ڕاستی و ناوەڕۆکەکان ناگۆڕن ...

لێم وەرگرە ... ئەم ئامۆژگاریە لەم ڕۆژگارەی کە ئامۆژگاری کاران زۆر کەم بوون تیایدا ...

ئـەم عابایـە عابایەکـە بـۆ ڕووتـی و سـفوری ، لـە گـەڵ هـەموو ئـەو ڕازاوەییەی کە تێیدایە ...

ئەگـەر خـۆ داپۆشـینت ئـەوێ ..؟؟ خۆداپۆشـین بـە پۆشـاکێکی بـە حیشمەت دەبێـت ... وە بەو حیجابە شەرعیە دەبێت کە شەریعەت پـێی هـاتووە ، و داوای دەکـات ( دڵنیـاش بە کـە حیجـابی شـەرعی ئەوەیـە کـە ئـافرەت پۆشـاکێکی فـراوان لـە بـەر بکـات ، هـەموو لەشـی دابپۆشـێت ، ڕازێنـراوە ، و بۆن خـۆش کـراو نـەبێت ، و سـەرنجی پیـاوان بۆ لای خـۆی ڕانەکێشێت ) .

ئەمەیـە حیجـابی شـەرعی ، ئەگـەر تـۆ بتـەوێت لـە بـەر ڕەزامەنـدی و گوێڕایەڵی خـوای پـەروەردگار بیپۆشـیت ، بـەڵام عابـای سەرشـان لـە ئـایین نیە ، بەڵکو دەرگایەکە بۆ هەموو ئاشووب و فیتنەیەك .

خوشـکی خـۆم ... ئـەی درووشمـی شـەرفداریمان ... ئـەی جێگـەی پارێزگـاری لـە ناموسمـان ... دەسـت بگـرە بـە حیشـمەت ... و حیجابـە شـەرعیەکەتەوە لــە سـەردەمی غەریبیـدا ، نەکـەی لــە بـەر توونـدی تاقیکردنـەوەکان تووشـی دڵـە ڕاوکـێ و دوو دڵـی بیـت و دوا بکـەویت لـە کاروانی حشیمەت دارێتی ، یان بە هۆی زۆری ئاشووب و فیتنەکانەوە .

نەکەی زۆری ئەوانەی کە دەیانبینیت مەلاَسەیان دێت بەدوای هەموو بێ نرخێکدا ، لاوازت بکات لە ڕێگەکەت ، چونکە تۆی بە نرختر و بلَندتر لە هەموان .

خۆت بپۆشە ئەو کاتە بڕوانە ... چەندەها کەسی پاك و پابەند بوو بە ئایین ئاواتی ئەوەیە کە تۆ ببیت بە هاوسەری ...چونکە متمانەی پێتە لە کاتی دەرچوونی ، و گران بەهاترین شتی ژیانی دەخاتە ژێر دەستەکانت

باشیش بزانە کە چەندەها کەسی بێ ئابڕو و درۆزن ( مستهتر ) هەن .. تەماشای ئەو ئافرەتە بێ نرخانە ناکەن جگە بۆ ئەوە نەبێت کە ( بوکە شووشەیەکی کاتین ... و بۆ کاتێکی دیاریکراوە ) !!!

خوشکی بە حیشمەت و حەیادارمان بە ئاگابە ... نەکو لە سەنگەری تۆوە هێرش بکرێتە سەر... ئاین ...و کەس و کار... و کۆمەڵگاکەت ...

حیجابەکەت ... حیشمەت و حەیاکەت ... گەوهەرەی بە نرخی تۆن ... نەکەی کەم تەرخەمیان تیادا بکەی .

هۆکارەکانی ڕووخاندنی کەسایەتی تۆ زۆرن ... لە هەموو لایەکەوە دەوریان لێ داویت ... جا بە ئاگابە ، و چاوکراوە بە .

ئاگادار بە ... بانگەشەکارانی خراپەکاری لە ڕێگەی تۆوە لە ناومان نەبەن ... و خەنجەری خیانەت کاریمان لە ڕێگەی تۆوە لە پشتەوە لێ نەدەن ... بە ئاگابە لە ناونەچیت ... چونکە لە ناوچوونی تۆ لە ناوچوونی ئوممەتێکە . وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**نوسینی : شێخ سالم العجمی ⁄ وەرگێڕانی : مامۆستا عدنان بارام**

## بۆ هەموو مرواریە خۆپارێزەکان

بۆ هەموو گەوهەرەیەکی بەنرخ، بۆ مرواریە خۆپارێزەکان، بۆ ئەو ئافرەتانەی کە بڕیاریان داوە پۆشاکی شەرم و حەیا لە بەر بکەن، چونکە فەرمانی پەروەردگاریانە، ئەوەش تەنها لە بەر ڕەزامەندی ئەو، بۆ ئەوەی بە بەهەشتی بەرین شاد بن... بۆ تۆ خوشکی موسڵمانم: کە پێشەوات خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، بۆ تۆ کە پابەندی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانیو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایت صلی الله علیه وسلم، نەك پابەندی مۆدە و سەرگەردانبووی شوێنی ئەم و ئەو... بۆ ئەو خوشکانەم: کە نایانەوێ هەڵخەڵەتاوی ئەو کەسانە بن کە بە ناو مافەکانیانەوە ئەیانەوێ پۆشاکی حیشمەتیان لە بەر ڕاماڵن، ئەوەش نەك لە بەر ئافرەتان بەڵکو لە بەر تێرکردنی ئارەزووە گڵاوەکانیان، بۆ ئەوەی لە کۆتایدا بەرێزیان وەکو گوڵێکی گەڵا هەڵوەریو بە جێبهێڵن !! دوای ئەوەی وەکو بوکە شووشەی دەستی منداڵان یاری خۆیانت پێ دەکەن !!! گەوهەرە بەنرخەکەم: ئەمە گوڵێکە لە باخچەی برایەتی بۆتم هەڵبژاردووە، بۆنی ئامۆژگاری و دڵسۆزی لێ دێت، بە شێوازی ئامۆژگاری دامڕشتووە، هاندەری نووسینی ویستنی خێر خۆشبەختیە بۆ تۆی وەك گەوهەری بەرنرخ و خۆپارێزە، بەڵکو جێگەی بایەخپێدانی تۆی بەڕێز

بێت، پەروەردگار پارێزەرت بێت... خوشكەكەم: لای بەڕێزتان شارەوە نیە هەموو ئەو هەوڵانەی كە كەسانی ئارەزوو پەرست بەرنامە ڕێژی بۆ دەكەن و پیادەی دەكەن بۆ لە خشتە بردنی ئافرەتی موسوڵمان، و لە دەستدانی حیشمەتی، دەبینین هەموو ساتێك هاتوهاوارێكە و هەموو ڕۆژێكیش مودەیەكی نوێیە !!! دەبینرێت و دەبیسترێت لە باسی باڵاپۆشی تۆی بڕوادار لە شێوە و شێوازی دورینیدا، ئەمەیان تەنك و ناسك !!! ئەویتریان تەسك یان كورت !!! یەكێكی تریش ڕازاوە و تەتریزكراو !!! هەموو ئەوەش بۆ ڕووشاندنی پاكێتی تۆ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، خوشكانمان بەوە بزانن یان نە... سكاڵای ئەو كارەش بۆ لای پەروەردگار بەرز دەكەینەوە...

گەوهەرەی خۆپارێزم: كار لەم سنوورەش نەوەستاوە بەڵكو گەشتۆتە ئەوەی كە بگاتە حجاب و باڵاپۆشەكەتان دەبینین دەستی خیانەتكارانی پێ گەیشتوە !!! ئەمەیان عابای فەرەنسیە !!! ئەویتریان عابای سەرشانە !!!ئەوەشیان لە ناوقەدەوە تەسككراوەتەوە بە گوێرەی ناوقەدی خوشكی باڵاپۆشم !!! یەكێكی تر ڕەنگاوڕەنگ و نەخشین و تەتریزكراوە !!! بەشێوەیەك پۆشینی حیجابیش بۆتە باشترین زەمینە بۆ پیادەكردنی مودە !!! و دەرخستنی جوانیەكان !!! جا نازانم كەی خوشكانی باڵاپۆشم هەست بە ترسناكی ئەو كارەیان دەكەن ؟ !یان بەوەی ئەو پیلانانە هەموو

بۆ لە خشتەبردن و لەکەدارکردنی حەیا و شەرم و شکۆی ئەوانە ؟!!

خوشکی خۆپارێزم: کە من دەبینم تۆ کەوتوویتەتە تۆڕی ئارەزووپەرستانەوە، ڕازی نەبووم لەوەی کە تۆ زیاتر بۆ هەڵدێر ببرێیت بۆیە بێدەنگ نەبووم، بەڵام ئایا تۆ هەستت بەوە کردووە کە تۆی بەڕێز کە باڵاپۆشەکەت پۆشیوە کە پەرستشێکە بۆ پەروەردگارت و بەهۆیەوە لە پەروەردگار نزیك دەبیتەوە ؟! چونکە کردەوەکەت وەڵامدانەوەی فەرمانی پەروەردگارتە، بەڵکو دەبێت ئەوەشت لا ئاشکرا بێت کە هەر نارەحەتیەکت تووشبێت بەهۆیەوە لە بەرامبەری پاداشت دەدرێتەوە، جا خۆشبەختی بۆ ئەو خوشکانەی کە بەو شێوە دید و چاوڕۆشنن و باڵاپۆشی حیشمەت و حەیایان پۆشیوە و بەو شێوەیەشە کە پەروەردگاریان فەرمانی پێکردوون، نەك بەپێی مودە و ئارەزووی ئارەزووپەرستان و چەواشەکاران... گەوهەری گرانبەها: دەبێت تۆ بزانیت باڵاپۆشەکەت ئەوەیە کە دەتپارێزێت لە چاوی نامەحرەم و جوانیەکانت دەرناخات، بۆ ئەوەی وەکو مرواریەکی پارێزراو بیت لە ناو باڵاپۆشەکەتدا، وە باڵاپۆشەکەشتە هۆکاری بەرزی و بڵندیت لە دونیا و دواڕۆژدا، ئەوەش بۆ ئەوەیە بەوەوە جیابکرێتەوە لە هەموو ئافرەتانی تر، وە تەنها باڵاپۆشەکەشتە لە چاوی گورگە برسیەکانی مرۆڤ، کە هەموو

کۆششێکیان ڕووشاندنی شەرم و شکۆی شکۆدارانە، بۆیە گەوهەرەی بەنرخ و مرواری خۆپارێز هەوڵی ئەوە بدە کە باڵاپۆشەکەت ئەم مەرجانەی تێدا بێت بۆ ئەوەی ئەم پەرستشەت وەکو هەموو پەرستشەکانی ترت تێروتەسەل و بیٚکەم و کوڕی بێت:

١- داپۆشەری هەموو لەش بێت، دەست و ڕوومەت نەبێت...

٢- نابێت پۆشاکەکە بۆ ناوبانگ، و شۆرەت بێت...

٣- ئەبێت ئەستوور بێت و ناسك نەبێت، بە شێوەیەك ڕەنگی پێست دەرنەخات...

٤- دەبێت فراوان بێت و تەسك نەبێت: واتە :بە شێوەیەك بێت قەبارەی ئەندامەکانت دەرنەخات...

٥- نابیٚ بخورکراو و بۆن خۆش کراو بێت...

٦- نابێت پۆشاکەکەی لە سەر شێوازی جل و بەرگی پیاوان بێت...

٧- نابێت پۆشاکەکەی لە سەر شێوازی جل و بەرگی ئافرەتانی بیٚ باوەڕان بێت...

٨- نابێت خۆی لە خۆیدا ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش بێت.

**لە کۆتایشدا** پێت دەڵێم بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت و نەکەی ببیت بە قوربانی شەیتان، و ئەویش بتکاتە فاکتەری لە خشتەبردنی کەسانی تر، مردن و ئازارەکانی گیان کێشان بخە پێش چاوی خۆت، و تاریکی گۆڕ هەرگیز لەیاد نەکەی، لەو ساتانەی جگە لە کردەوەکانی خۆت نەبێت هیچ هاوەڵ و هاودەمێکت نیە، وە بەردەوام یادی دواڕۆژ بکەرەوە کە چەند سەخت و دژوارە، بیر لەوەش بکەوە کە دەبێت ڕۆژێك بە سەر پردی سیڕاتدا بڕۆیت، ڕۆژێکیش دێت کە نامەی کردەوەکان بڵاودەکرێتەوە کەسێك بەدەستی چەپ و ئەویتریش بە دەستی ڕاست... لەو کاتانەدا پەشیمانی دادت نادات، گریانیش هیچ سودێکی نیە کۆمەڵانێك بۆ دۆزەخ دەڕۆن و کۆمەڵانێکیش بۆ بەهەشتی بەرین، خوای پەروەردگار پارێزەرت بێت لە هەموو خراپە ودژواریەکی دنیا ودواڕۆژ.

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**مامۆستا عدنان بارام**

# پەیامێك بۆ خوشكی پابەندبووم بەئایینەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەڵێن زۆرێك لەئافرەتانی پابەندبوو بەئایین پێچەوانەن سەبارەت بەپابەندبوونەكەیان بەئایینەوە ئەوەش لەبەرئەوەیە كەهەڵناسن بەبینینی ڕۆڵێكی ئاشكرا لەبانگەشەكردن بۆلای خوای پەروەردگار لەگەڵ ئەوەی كەهەستیش دەكەن بەو هێرشە دڕندە بەردەوامەی كەدەكرێتەسەر ئافرەتانی موسڵمان ئەوانەی كەهەوڵی ئەوەیانە كەدووریان بخەنەوە لەئایینەكەیان وەلەگەڵ ئەوەی كەهەستیش دەكەن بەو دووری یە گەورەیەی كەلەزۆرێك لەئافرەتانی كۆمەڵگاكەمان دەبینرێت دووركەوتنەتەوە لەفەرمانەكانی شەرع.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەبینن ئەوەی كەبەسەر ئوومەتەكەدا هات لەناسۆری و دەردەسەری ئەوەش هیچ چارەسەرێكی نی یە ئیللا گەڕانەوە نەبێت بۆلای خواو بانگەشەكردن بۆ ئەوە.

هەروەها لەگەڵ ئەوەش زۆربەیان گەشتوونەتە ئەوەی كەڕۆڵیان گەورەترین ڕۆڵەو گرنگە بۆ چاككردنی ئافرەتان لەكۆمەڵگاكەماندا.

ئایا ئەمە ڕاستە؟!

دەشتوانیت وەڵامەکەی دیاری بکەیت بۆ خۆت پاش وەڵام دانەوە لەسەر ئەم پرسیارانەی خوارەوە:

١. ئایا گەورەترین خەمت کەهەڵتگرتووە لەهەموو کات و شوێن و بۆنێکدا خەمی بانگەشە بووە؟

واتە: چۆن بانگەشەی غەیری خۆت بکەیت بۆلای خواو بارودۆخی چاك بکەی و چۆن کارێك بکەی بۆ ئەوەی یارمەتی یان بدەیت و ڕزگاری ئەم ئوومەتە بکەیت و بیانگەڕێنیتەوە بۆ دەست گرتنێکی ڕاستەقینە بەئایینەکەی، ئەو ئایینەی کەتەنها ڕێگەیەکە بۆ سەرخستنی و سەرکەوتنی، وەئایا گران بەهاترین کات و هەوڵ و داراییت بەخشیوە لەپێناویدا؟

٢. ئایا سووربوویتە لەسەر ئەوەی کەهیچ دەست بەتاڵییەك بەفیڕۆ نەدەیت یان هەر بۆنەیەك کەئامادەبوویتە تیایدا بەبێ ئەوەی کردارێکت تیایدا کردبێت لەپێناوی چاککردن و بانگەشەکردن و ئاڕاستەکردن ئیتر ئەگەر بەووتەیەکی بەسوود بێت یان بەهەرچ ڕێگەیەکی تر بێت؟

٣. ئایا گرنگیت داوە بەهاوسێکانت و چاکەت کردووە لەگەڵیانداو هەستاویت بەوەی کەهەفتانەیان بۆدانەی بۆ ئەوەی یادو زیکری خوای

تیابکەن کەئەوەش هۆکارێکی کاریگەرو ئاسانە بۆ چاك بوونیان وەئایا هەستاویت بەوەی کەبەبەردەوامی کاسێت و کتێب دابەش بکەیت بەسەریاندا.

٤. ئایا خەمی کەس و کارە نزیکەکانت دەخۆیت و هەوڵی ئەوە دەدەیت پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەبێت و کاریگەریت لەسەریان هەبێت بەهەموو ڕێگە جۆراوجۆرەکان کەباشترین ڕێگەشیان بریتییە لەدابەشکردنی کاسێت و کتێب بەشێوەیەکی دیاری کراوو بەردەوام؟ وەئایا هەوڵی ئەوەت داوە کەچاودێری بارودۆخیان بکەیت و چاکەیان لەگەڵدا بکەیت و گرنگیشت داوە بەکێشەکانیان و هەڵساوی بەکردنی وانەیەکی بەردەوام بۆیان ئەگەر لەتوانادا بوو؟

٥. ئایا گرنگیت داوە بەبانگەشەکردنی منداڵان و تازە پێگەیشتووان لەخێزان و هاوسێکانتداو ڕێنموونییانت کردووە بۆ هەموو ئەو شتانەی کەچاکەی تێدایە؟

٦. ئایا هاوسێ و کەس و کارە نزیکەکانت یادخستووەتەوە بەباسی خێرکردن و چالاکییەکی سوودبەخش وەهەوڵی ئەوەت داوە کەپەیوەستیان بکەیت بەوەوە؟

٧. ئەگەر تۆ مامۆستایت یان قوتابیت ئایا هەوڵێکی زۆرت داوە بۆ ئەوەی بانگەشەی ئەوانە بکەیت کەلەگەڵتدان لەقوتابخانەکەدا؟

٨. ئایا هاوبەشیت کردووە لەهەر چالاکییەکی ئافرەتان بەبەشداری کردن بێت لەبانگەشەکردن بۆلای خوای گەورەو گەیاندنی چاکەو خێر بەخەڵکی؟

٩. ئایا هاوبەشیت کردووە لەو کۆڕو کۆمەڵە ووتارخوێنە گشتیانەی کەبۆ ئافرەتانە وەئەو دەست نووسانەی کەبۆ گۆڤارە ئیسلامییەکانە ئەگەر تۆ لەوانەی کەتوانات هەیە لەسەری، یان تۆ بەهانە ئەهێنیتەوە لەوەدا بۆ کەمترین بەهانەیەك کەتووشت بووە لەگەڵ زانینت بەگرنگی کارەکەو پێویستی یەتی؟

١٠. ئایا کارەکانت ڕێکخستووەو هەوڵ و کۆششت تیاداوە بۆ ئەوەی بەشێکی باشت هەبێت لەزانین و زانیارییەکی شەرعی کەئەوەش شتێکی بنچینەیی یە بۆ بەردەوامی و سەرکەوتنت لەبانگەشەکەتدا؟

١١. ئایا تۆ پێشەنگێکی ڕاستەقینە بوویتە بۆ ئافرەتانی کۆمەڵگاکەمان لەهەموو ئەو شتانەی کەپەیوەستن بەشێوەو شێوازی ئافرەتانی موسڵمانەوە؟

١٢. ئایا یارمەتی مێردە بانگەشەکارەکەت داوە بەوەی کەبارودۆخێکی گونجاوی بۆ بڕەخسێنی و هانت داوە بۆ کارو کرداری چاکەو حیسابی ئەوکاتەت کردووە کەبەتەنها بەسەری دەبەیت لەماڵدا بۆ ئەوەی خۆت خەریك بکەیت بەئیشێکەوە باشترە لەوەی کەسەرزەنشت و لۆمەی مێردەکەت بکەیت؟ یان ئەگەر مێردەکەت لەبانگەشەکاران نییە ئایا هانت داوە لەسەر پابەندبوون بەئایینەوەو بانگەشەکردنەوە؟

١٤. ئایا کردەوەیەکی جدیت کردووە بۆ ئەوەی منداڵەکانت پیٚ بگەیەنی بەپیٚ گەیاندنێکی چاك بۆ ئەوەی بپارێزرێن لەشوێنەواری هەموو ئەوانەی کەپێچەوانەی شەریعەتن هەروەها بۆ ئەوەش کەئەوان لەوانەبن کەخەمی ئایینەکە هەڵگرن و هەوڵی ئەوە بدەن کەئایینەکە سەربخەن و خزمەتی بکەن؟

١٥. پاشان و کۆتایی ئایا هەستاویت بەنویٚ کردن و جوان کردنەوەی هۆکارە بانگەشەییەکان بۆ ئەوەی کاریگەرییەکەی بەهێزتر بێت و چاکەکەشی زیاتر بێت؟

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**دایکی سوننە**

# خوشکی بەڕێزم پێش ئەوەی بچیت بۆ بازاڕ

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

**ئەم نوسینە کورتە بریتیە لە کۆمەڵە ئامۆژگاریەك سەبارەت بە ئافرەتان لەکاتی چوونە بازاڕدا, جا داواکارم لەخوای گەورە کە ئەوەی دەیخوێنێتەوە سوودی پێ بگەیەنێت و کاریگەری هەبێت, جا ئومێدەوارم لە بەڕێزتان کە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکەن وجێ بەجێی بکەن, چونکە لە سزای خوا دەپارێزرێیت, هەم ڕەوشت وئاکارت قورس وسەنگین دەبێت ودینت سەلامەت دەبێت, هەمیش پاداشتت دەدرێتەوەو خێرت بۆ دەنووسرێت.**

**١- خوشکم بزانە کە بازاڕەکان خراپترین شوێنی زەوین بەلای خوای گەورەوە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت " أحَبُّ الْبِلادِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَسَاجِدُهَا ، وَأَبْغَضُ الْبِلادِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَسْوَاقُهَا " واتە: خۆشەویستترین شوێن وجێگا بەلای خواوە مزگەوتەکانەو بێزراوترین شوێنیش بازاڕەکانە.**

**٢- بازاڕ شوێنێکە کە شەیتانەکان تێیدا کۆ دەبنەوە, چونکە سەلمانی فارسی (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت " ئەگەر توانیت هەوڵ بدە یەکەم**

کەس مەبە کە دەڕۆیتە بازاڕەوەو دوایەمین کەسیش مەبە کە لێی دێیتە دەرەوە, چونکە بازاڕ شەڕگەی شەیتانەکانە وئالاّی تێیدا هەڵ دەدات".

٣- ئەی خوشکی بەڕێزم ئەگەر لەبەر پێویستیەکی زۆر گرنگ نەبێت مەچۆ بۆ بازاڕ.

٤- ئەو شت ومەکانەی کە دەتەوێت دیاری بکە پێش چوونە بازاڕت, وە ئەگەر تەواویش بوویت لە کڕینی ئەو شتانە بەبێ دواکەوتن بگەڕێوە ماڵەوە.

٥- ووریابە لەگەڵ بەسەربردن وبەفیڕۆچوونی کاتەکانت لە بازاڕدا.

٦- خۆت بەتەنها هەرگیز مەچۆ بۆ بازاڕ, چونکە خراپەکاران چاوت تێ دەبڕن.

٧- هەرگیز لەگەڵ شۆفێرێکی نامەحرەم بەتەنها سواری ئۆتۆمبیل مەبە چونکە ئەوە بەتەنها کەوتنی حەرامە, وە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلی اللە علیە وسلم) کە دەفەرموێت" لَا يَخْلُوَنّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا ومَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ " واتە: هەرگیز پیاوێك بەتەنها نەکەوێت لەگەڵ ئافرەتێکدا مەگەر لەگەڵ مەحرەمێکدا نەبێت.

٨- پابەندبە بە حیجابی ئیسلامی (عابا) و بەڕێزو سەنگینیەوە بچۆرە ناو بازاڕەوە, چونکە بازاڕەکان شوێنانێکن کە زۆربەی خراپکارو خاوەن دڵە نەخۆشەکان تێیدا کۆدەبنەوە.

٩- سووربە لەسەر خوێندنی دوعای بازاڕ, چونکە پێغەمبەری خوا (صلی اللّه علیه وسلم) دەفەرموێت :

" مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ :

لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ " واتە: ئەوەی بچێتە بازاڕو ئەم دوعایە بخوێنێت: (**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**), ئەوا خوای گەورە هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسێت وهەزار هەزار خراپەی لێ دەسڕێتەوەو هەزار هەزار پلە بەرزی دەکاتەوە.

١٠- چاوت داخە لەئاست پیاوی نامەحرەم, چونکە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ واتە :

بەژنانی باوەڕدار بڵێ: با چاویان دابخەن لە تەماشای نامەحرەم وعەورەتیشیان بپارێزن لە گوناه.

١١- وریابە لەوەی بۆنی خۆش بەکاربهێنی، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت "أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ " واتە: هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکات وپاشان دەربچێت وبەلای کۆمەڵە پیاوێکدا تێپەڕبێت کە بۆنەکەی بێت بەسەریاندا ئەوا ئافرەتەکە زیناکارە.

١٢- پرسیار لە شتێك مەکە پەیوەندی پێتەوە نەبێت و جێی گرنگی تۆ نەبێت، چونکە لەچاکێتی موسڵمانێتی مرۆڤەوەیە کە واز لەشتێك بهێنێت پەیوەندی پێیەوە نەبێت.

١٣- زۆر وریابە لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ فرۆشیاراندا و بەلەنجەو نەرمیەوە قسە مەکە، وە زۆر بەلای چەپ وراستتدا لا مەکەرەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت :﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ واتە: لەگەڵ نامەحرەمدا قسە بەنەرمی وناسکی ونازەوە مەکەن، واتە لەکاتی گوفتارتاندا دەنگتان نەرم وناسك مەکەن لەگەڵیاندا

نەوەکو ئەو کەسەی کە دڵی نەخۆشە تەماح بیگریٚ وبورووژێت ئەبیٚ ئێوە هەمیشە قسەی چاکوشیاو بکەن.

١٤- قسە درێژمەکەرەوەو بابەت مەکەرەوە لەگەڵ فرۆشیارەکاندا.

١٥- هەرگیز بەتەنها نەکەویت لەگەڵ دوکاندارو فرۆشیارەکاندا لە دووکان وجێگای مەخزەن وشوێنی تر, چونکە ئافرەتی بڕوادار خۆی دەپارێزێت لە شوێنی گومانــاوی چ جای شوێنێکی حەرام, کەبە دڵنیاییەوە بەرەو حەرامیش دەتبات.

١٦- کاتی گونجاو هەڵبژێرە بۆ چوونە بازاڕ.

١٧- شتی زیاد لە پێویستیش مەکڕە, چونکە ئیسراف وزیادەڕۆییەو نیشانەی پشتگویٚ خستنی نیعمەتی خوای گەورەیەو لەکاروکردەوەی شەیتانەکانە.

١٨- شوێنی داب ونەریت وشتی مۆدێرن وتازەباوی ناشیاوو نادروست مەکەوە, چونکە ئافرەتی موسڵمان تایبەتمەندی خۆی هەیە.

١٩- ببە بەسەرمەشق و مامۆستایەکی چاولێکار بۆ دەوروبەرت و خوشکانت لە قسەوگوفتارو ڕێکردن و دیمەن و هەڵسوکەوتت.

٢٠- ئەگەر کەلو پەلێکی ماڵت پێویست بوو ئەوا دەتوانی بە مێردەکەت یا براکەت یان باوکت بڵێی  و مەرج نیە بۆ هەموو شتێکی بچووك سەردانی بازاڕ بکەیت ئیللا مەگەر شتانێك نەبێت کە تایبەت بێت بە ئافرەتانەوەو ئەوان نەتوانن یان نەزانن بۆت بکڕن وەکو جلو بەرگ و ....

خـــوای گەورە بتپارێزێت

خوای میهرەبان هەمووان سەرکەوتووبکات.

بەو خوایەتان دەسپێرم کە سپاردە زایە ناکات.

پشتیوان حسن کەرەم

# گرنگیدانی ئیسلام بە ئافرەت

الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ، أما بعد :

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لە زۆرێك لە دەستەواژەكانی ڕاگەیاندنەوە ئەوەمان بە گوێدا دەدرێت كە ئیسلام ئاینێكە ستەمی لە ئافرەت كردووە و بێبەشی كردووە لەو مافانەی كە پێویستە پێی بدرێت ، خاوەنی ئەم وتانەش یان موسڵمانێكی ساویلكەی تێنەگەیشتووی تەڵقین كراوە ، یان دژە دینێكی ئارەزوو پەرستی بە پارە و پلە و پایە هەڵخەڵەتێنراوە ، ئەوەندە ئەو قسانەیان وەكو تووتی دووبارە كردووەتەوە خەریكە ئافرەتانی موسڵمان تووشی گومان و دڵە ڕاوكێ بكەن سەبارەت بە ئایینەكەیان ، ئێمەش لەبەر مەترسی وشوێنەواری ئەو قسانە حەزمان كرد ئافرەتان بە بەشێكی زۆر كەم لەو مافانە ئاشنا بكەین كە ئایینەكەیان پێی بەخشیون و ئەوان لێی بێئاگان ، بە هیوای ئەوەی ئافرەتان خۆشیان بەشێك لەو هەموو كاتانەی كە بەفیڕۆی دەدەن تەرخان بكەن بۆ تێگەیشتن لە ئایینەكەیان ، چونكە بە ڕاستی شەرمەزاریە بۆ مرۆڤ لە سەردەمێكدا كە بە سەردەمی زانست ناسراوە خاوەنی بیروباوەڕێكی حەق بێت لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاییەكی ( ئەگەر چی كەمیش بێت ) لە بارەی بیروباوەڕەكەیەوە نەیبێت ، بۆیە داوامان لە خوشكانی موسڵمانمان

ئەوەیە :هەوڵی شارەزابوون بدەن لە ئایینەکەیان ، بۆ ئەوەی بە پیلانی نەیارانی ئەم دینە حەقە هەڵنەخەڵەتێن و لە ئایینەکەیان لا نەدەن .

**بەراوردێك لە نێوان :**

**مافەکانی ئافرەت لە سەردەمی نەفامی و سەردەمی ئیسلامدا**

١. لەسەردەمی نەفامی ( جاهیلی )دا خەڵکی ڕقیان لە ئافرەت بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ( سورة النحل : ٥٨ ) .

واتە: خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك لەو نەفامانە ، ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە .

ئافرەتیان بە سووك و بێ ڕێز تەماشا دەکرد ، و هەر بە زیندوویەتی دەیانکرد بە ژێر خۆڵەوە ، بەڵام ئیسلام هات ئەو کارەی قەدەغە کرد ، و بانگەشەی ئەوەی کرد و ئەوەی لەسەر موسڵمانان فەرز کرد کە پێویستە ڕێز لە ئافرەتان بگرن و لە گەڵیاندا چاك بن و مافەکانیان پێشێل نەکەن ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ * بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾ (سورة التكوير : ٨-٩ ) .

**واتە: کاتێك کچی زیندە بە چاڵ کراو پرسیاری لێدەکرێت . بە چ گوناهێك ، بە چ تۆمەتێك کوژرا ؟!**

**وە پێغەمبەری خوایش ﷺ فەرموویەتی:** " من عال جاريتين – بنتين – حتى يبلغا جاء يوم القيامة أنا وهو كهاتين " (رواه مسلم).

**واتە: هەرکەسێك دوو کچ بە خێو بکات تاوەکو پێ دەگەن و بالغ دەبن ڕۆژی قیامەت من و ئەو کەسە وەکو ئەم دوو پەنجەیە – نزیکین لە یەکەوە – .**

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** " من ابتلى من هذه البنات بشيء فأحسن إليهن كنَّ له سترا من النار " (رواه البخاري ومسلم) .

**واتە: هەرکەسێك خوای گەورە تاقی بکاتەوە بە پێ بەخشینی کچ وە ئەویش باش بێت لەگەڵیاندا ( بە جوانی بەخێویان بکات و پەروەردەیان بکات ) ئەوا ستری دەکەن لە ئاگر .**

**٢. لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا خەڵکی میرات ( ئەو پارە و ماڵەی مردوو دوای خۆی بە جێی دەهێڵێت ) نەیان دەدا بە ئافرەت ئەگەر چی شیاوی وەرگرتنیشی بوایە ، بەڵام کاتێك ئیسلام هات بە باشترین شێوە بەشە میراتی ئافرەتی دیاری کرد و مافی خۆی پێدا ، خوای گەورە**

دەفەرموێت: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ ( سورة النساء: ٧) .

واتە: پیاوان بەشیان هەیە لەو شتانەدا كە باوك و دایك و خزمان بە میراتی لە دوایان بە جێ دەمێنێت، هەروەها ژنانیش بەشیان هەیە لەو شتانەدا كە باوك و دایك و خزمان بە میراتی لە دوایان بە جێ دەمێنێت ، لە كەم و زۆری بەشی هەركەسێك دیاری كراوە و دەبێت بیدرێتی .

٣. لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا پیاوان وەكو چۆن ماڵ و موڵكی مردوویان بە میراتی وەردەگرت بە هەمان شێوەش خێزانی كابرای مردوویان وەكو میراتی بۆ خۆیان دەبرد ، هەر كە پیاوەكە مرد پیاوێكی تر دەهات پۆشاكێكی دەدا بە سەر ئافرەتەكەدا و دەیوت: بوو بە بەشە میراتی من هەروەكو چۆن ماڵەكەیم بە میراتی برد ، بەڵام ئیسلام ئەمەی حەرام كرد ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا﴾( سورة النساء: ٩ ) . واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دروست نیە بۆتان ژنان بە زۆر بكەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسەردا بگرن ( وەكو كەلوپەلی تری ناو ماڵ ) .

٤ . لە سەردەمی نەفامیدا پیاو ڕێگر بوو لە شووكردنی ئەو خێزانەی خۆی كە تەڵاقی داوە هەتاوەكو هەموو ئەو شتانەی بۆ نەگێڕێتەوە كە لەسەر ژنەكە خەرجی كردووە ، وە باوك كچەكەی و برا خوشكەكەی خۆی لە شووكردن قەدەغە دەكرد ئەگەر بیویستایە ، وە پیاو خراپ مامەڵەی لەگەڵ خێزانەكەی دەكرد و تەڵاقی نەدەدا تاوەكو فیدیەی پێ نەدایە .

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾(سورة النساء: ١٩ ) .

واتە : ناچاریان مەكەن تا هەندێك مارەییتان بۆ بگەڕێننەوە، مەگەر ئەوان گوناهێكی ئاشكراو دیار ئەنجام بدەن.

وە فەرموویەتی: ﴿فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ﴾( سورة البقرة : ٢٣٢ ) .

واتە: ئێوە ( ئەی كەس و كاری ژن ) مەبنە كۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بكەنەوە بە هاوسەرەكانیان ( یاخود ویستیان شوویەكی تر بكەن ) ، كاتێك ئەوان لە نێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان نواند بە شێوەیەكی جوان .

٥. لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەت بە دەست ستەمی مێرد و ڕەوشت خراپی و خراپ مامەڵەکردنیەوە دەینالاند ، بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەمەی قەدەغە کرد ، و فەرمانی بە پیاو کرد کە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و جوان مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتداهاوژینیان لەگەڵدا بە جوانی بەرنەسەر . بکات ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾(سورة النساء:١٩).واتە: هاوژینییان لەگەڵدا بە جوانی بەرنەسەر .

وە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾( سورة البقرة: ٢٢٨ ) .

واتە: ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بە وێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان بە گوێرەی باو و نەریتێك کە پەسەندە لە ئیسلامدا .

٦. لەسەردەمی نەفامیدا عیددەی ئافرەت لە دوای مردنی پیاوەکەی یەك ساڵ بوو ، بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەم ماوەیەی کەم کردەوە و کردی بە چوار مانگ و دە ڕۆژ ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ ( سورة البقرة : ٢٣٤ ) .

٧. ئیسلام وەصیەتی کردووە بە جوان ڕەفتاری و مامەڵەی باش لەگەڵ ئافرەتدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " واستوصوا بالنساء خيرا " ( متفق عليه ) .

**وە فەرموویەتی ﷺ : " لا يفرك مؤمن مؤمنة إن كره منها خلقا رضي منها آخر " (** رواه مسلم ) .**واتە: با پیاوی بڕوادار ڕق و کینە لە خێزانە بڕوادارەکەی هەڵنەگرێت ، چونکە ئەگەر ڕقی لە ڕەوشتێکی بێت ، لە ڕەوشتێکی تری ڕازیە .**

**وە فەرموویەتی ﷺ : " خيارکم: خيارکم لنسائهم "** ( رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح ) **واتە: چاکترینتان : چاکترینتانە بۆ خێزانەکانیان .**

**وە فەرموویەتی ﷺ :" الدنيا متاع وخير متاعها المرأة الصالحة "**( رواه مسلم) .

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە کە ئافرەتی چاك کامەیە و هەندێك لە سیفەتەکانی لەم فەرموودەیەدا دیاری کردووە : ( إذا نظر إليها سرَّته وإذا أمرها أطاعته وإذا غاب عنها حفظته في نفسها وماله " (رواه أحمد والنسائي) .**

**واتە: ئەگەر پیاوەکەی تەماشای بکات دڵخۆش دەبێت ، و ئەگەر فەرمانی پێ بکات گوێڕایەڵی دەکات ، و ئەگەر لێی دوور بکەوێتەوە ( بۆ نموونە پیاوەکە بچێت بۆ سەفەر ) ئابڕووی پیاوەکەی دەپارێزێت بە پاراستنی خۆی وە ماڵەکەشی دەپارێزێت .**

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات

**إدريس محمود**

# نامەیەکی ئامۆژگاری بۆ کچێکی گوێگر

الحمد الله والصلاة والسلام على نبينا محمد رسول الله وعلى آله وصحبه..

**خوشکی** باوەڕدار ڕەنگە بەلاتەوە سەیر بێ گەر هاتوو برایەك بەپەرۆشەوە ئامۆژگاری کردی, ئەمجارەیان لەسەرە ڕێگا و لەبەرچاوی خەڵکی ئامۆژگاریت ناکەم, تەلیفۆنیشت بۆ ناکەم, نامەیەکی بۆن خۆشیشت بۆ نانووسم, چونکە پەروەردگار ڕێگای ئەو شتانەم نادا, ڕێگای تریش هەیە, بۆیە لەڕێگەی ئەم نووسینەوە بەپەرۆشەوە ئەم چەند دێڕەت پێشکەش دەکەم, بزانە پەرۆشی برایەکی ئیماندار بۆ خوشکێکی هیچ کەمتر نی یە لەپەرۆشی بۆ پاراستنی (شەرەف و ناموسی) بەتایبەتی لەڕوانگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە, ئەم پەرۆشیەش جۆرێك نیە لە خۆتێهەڵقورتاندن, بەڵکو ئازارێکە دڵی پڕجۆشی برایەك ئەگوشێ تا وای لێ دەکات ببێتە هەڵگری بەشێك لەکۆڵی پڕخەمی خوشکەکانی, ئەم چەشنە ئازارەش تەنها لەدڵی ئەو برایانەدایە کە باوەڕێکی تەواویان هەیە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و کاری پێ ئەکەن و ڕوکنەکانی جێ بەجێ دەکەن..

ئەم نوسراوەش لەناخی کەسێکەوە سەرچاوەی سەندووە کە بەپەرۆشەوە خامەکەی لە گۆڕەپانی تێنوسەکەی وەك ئەسپە شێیەك تاوئەداو ئەنوسێ.. بۆ کێ ئەنوسێ؟؟ بۆچی ئەنوسی؟؟بۆ تۆی کچی ئێستا و ژنی سبەی و دایکی دواڕۆژ..

بۆ تۆ ئەنوسێ بۆ ئەوەی لە ڕێگای ڕاست لانەدەی و بە هەڵەدا نەچی..

**خوشکی خۆم:** زۆر ئافرەت هەن شەیتان بووەتە کێویکی زەبەلاح لەبەردەمی دا و ڕاستی ئاییینەکەی لە بەرچاوی وون کردووە و دایپۆشیوە, بۆیە دەبینین ڕۆژ تا ئێوارە بەهانە بۆ خۆی ئەهێنێتەوەو جارێك جلی ناشەرعی لەبەرئەکا و جارێکیش نیوە سەرپۆشێك و جارێکیش بۆ ماوەیەکی زۆر لەیادی ئەکا و هەندێ جاریش پەیوەستی ئەکا بە مانگی ڕەمەزانەوە, لەو وابێ خۆپۆشین تەنها لە مانگی ڕەمەزان واجبە.

زۆر جاریش جلی مۆدە و سەرپۆشێکی تەنك لەسەرئەکا یان هەموو جوانییەکانی خۆی زیاتر بەدەرئەخا ئەمەش بە بەهانەی ئەوەی هاوەڵەکانی ئەم جۆرە جلە لەبەرئەکەن یان ڕۆژگارەکە پێویستی بەم جۆرە پۆشاکە هەیە یان پێشکەوتن لەو پۆشاکە ئەبینێ و یان ئەڵێ خەڵکی پێم

ئەڵێن دواكەوتووە, خەڵكی.. خەڵكی.. خەڵك لێرەو.. لەوێ.. باشە ئەی پەروەردگارت بیرچوو كە پێمان ئەڵێ: ﴿وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾ (الأحزاب_٣٧) .

واتە : لەخەڵكی دەترسیت بەلاّم خوا لە پێشترە كە حسابی بۆ بكەیت و لێی بترسیت .

یان دەفەرموێ:﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾(آل عمران_٨٥). واتە: ئەوەی جگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێكی تر بكات لێی وەرناگیرێت. سوێندت ئەدەم بە پەروەردگار گەر مرۆڤێك دروستی كردبای هەرچی یەكی بووتایە بە گوێت نەدەكرد؟ بۆ تەنها پێت ئەڵێم پەروەردگارت داوات لیّدەكا جوانیيەكەت بۆ خەڵكی ئاشكرا مەكە تەنها بۆ ئەو كەسانە نەبێت كە ئایینی ئیسلام ڕێگەی پێداوی, هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ ﴾ (النور_٣١). واتە: وەبا جوانی و ڕازاوەیی و زینەتی خۆیان بەدەرنەخەن تەنها بۆ مەحرەمەكانیان نەبێت.زیادەڕەوی كردنیش لەخۆڕازاندنەوە و دەرخستنی جوانی بەشێكە لە كوفركردن بەو نیعمەتەی پەروەردگار پێی بەخشیوی, بیرت نەچێ ئەو زاتەی جوانی پێ بەخشیوی دەتوانێ لێتی بباتەوە..

بۆیە لەم ڕۆژگارەدا زۆر خوشك كە پۆشاكی شەرعی لەبەرئەكات ئەوەندەی نەخش و نیگار پێوەیە دەبێتە ئەو تابلۆ ڕەنگاو ڕەنگەی هەموو كەس تەماشای ئەكاو تێرنابێ لێ ی. ئەی لەچكەكانیان, زۆرجار جۆرە لەچكێك بەسەردا ئەدەن و بەجۆرێكی وا ڕێكی ئەكەن, ڕەنگە بەبێ لەچك هێندە سەرنجی لاوەكان ڕانەكێشێ, بەڕاستی زۆرێك لەو خوشكانەی بە حسابی خۆیان پۆشاكی شەرعی یان لەبەرە هێندەی سفورەكان سەرنجی دەوروبەر ڕائەكێشن. بۆیە گەر ئافرەتی ئیماندار سوود و قازانجی پۆشاكی شەرعی و حیجابی زانیبا هێندە ئاسانكار نەئەبوو لە پۆشینی بەڵكو بەو شێوەیەی ئەپۆشی كە پەروەردگار ئەمری پێكردووە. پەروەردگار خۆی دروستی كردووی هەر خۆشی ئەزانێ چی باشە بۆتان و چیش خراپە بۆتان, گەر حیجاب كردنیش سوود و قازانجی نەبوایە بۆتان هەرگیز خوای پەروەردگار فەرزی نەدەكرد لەسەرتان.

**تەنها ماوەتەوە بڵێم ئەمەی خوارەوە چەند خاڵێكن لە سوود و قازانجەكانی حیجاب كردن بۆ هەموو ئەو كچانەی سست و كەم تەرخەمن لە حیجاب كردن:ـــ**

(١) حیجاب پارێزەری ئافرەتانە لە چاوی ئێرە پێ بەران (حاسدین), بەتایبەتی ئەگەر خوای گەورە جوانیەكی بێ وێنەیی پێ بەخشیبێ لە

قژ و بالاٌ و ڕوخسار, بەڕاستی ڕاست ئەفەرمویٌ ئەو زاتەی کە ئەفەرمویٌ:
﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ (الفلق ــ٥)

(٢) حیجاب پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ ئافرەتان بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوای پەروەردگاریان لە کاتێکدا پەروەردگارتان داواتان لیٌ ئەکات جوانی یەکانتان ئاشکرا نەکەن تەنها بۆ مێردەکانتان و ئەو کەسانەی خوای پەروەردگار ڕێگای پیٌ داون, هەروەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ (النور ــ٣١).واتە: وەبا جوانی و ڕازاوەیی و زینەتی خۆیان بەدەرنەخەن تەنها بۆ مەحرەمەکانیان نەبێت..

(٣) حیجاب ڕێزلێنانە لە ئافرەت چونکە بەهۆیەوە هیچ کەسێك ناتوانیٌ تەماشایی بکات تەنها ئەوانە نەبیٌ کە پەروەردگار ڕێگەی پیٌ داون, بەم شێوەیەش ئافرەت ڕزگاری ئەبیٌ لەوەی کەوەك شت و مەك و کالاٌ ئەم دەست و ئەو دەستی پیٌ بکریٌ یان هەرکەسیٌ بە ئارەزووی خۆی سەیری بکات و پاشان گوزەر بکات.

(٤) لەڕووی سیفاتەوە حیجاب ئافرەتان ئەباتە ئاستی حۆری‌یەکانی بەهەشت کە پەروەردگار لەبارەیانەوە ئەفەرموێت: ﴿فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ﴾ (الرحمن ــ٥٦) واتە: لەو بەهەشتەدا حۆری

تیادایە کە تەنها تەماشای هاوسەرەکانیان دەکەن ، پێش ئەوان دەستی کەسیان لێ نەکەوتووە ، نە لە گرۆی ئادەمی و نە لە پەری .

ئاشکرایشە لەکاتی تێڕوانین چاوەکان تیرێکی نەبینراوی ژەهراوی ئاڕاستەی دڵەکان ئەکەن بەمەش هەست و ئارەزووی بەرامبەر ئەبزوێنێ بەمەش وای لێدەکات هەموو کاتی تەرخان بکات بۆ تێفکرین بەوخاوەن تێڕوانینە.

لەمەش دا حیکمەتی ئەو ئایەتە بەدەرئەکەوێ کە پەروەردگار ئەفەرموێ:
﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الأحزاب_٥٩)..

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیمانداران بڵێ کە بەپۆشاکی بالاپۆش (واتا عابا) خۆیان دابپۆشن, ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن کە ئەمانە بەحەیا و پاك و ڕەوشت بەرزن تاوەکو ئازار نەدرێن..

لە چاو نەپاراستنیشدا ئافرەت و پیاو هەردوولا تاوانبارن بەڵام ئافرەت زیاتر, چونکە گەر ئافرەت باش خۆی بپۆشێ و پرچی خاوی نەداتە دەستی شەماڵ و چاوەکانی نەگێڕێ ئەوا تێڕوانینەکانی لەیەك لاوە

ئەبێت, ئەویش لایەنی پیاوان , گەر ئافرەتان وەڵامدانەوەیان نەبوو ئەوا چاوی پیاوانماندوو ئەبێ و ملی ئەو ڕێگایە ئەگرێ کە لێیوە هاتووە, بە پیاوانیش ئەڵێم خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ﴾ (النور_٣٠).. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ : چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم)هەروەها ناموس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن

بۆیە هەتا ئافرەتان بەشەرم و حەیاو لەسەرخۆبن هێشتا کەمە, حیجابیش باشترین پشت و پەنایە بۆ شەرم و حەیا.. بەڵام زۆربەی پیاوان ئۆباڵی تاوانەکان ئەخەنە سەر ئافرەتان, ئەو ئافرەتانەی بە سفوری جوانی خۆیان بەدەرخستووە و دەستی‌یان لە شەرم و حەیای خۆیان هەڵگرتووە..

خوشکی باوەڕدار: داواکارم لە پەروەردگار هەموو ئافرەتێکی خراپ هیدایەت بدات بۆ سەر ڕێگای ڕاست و دروست و وایی لێبکات پۆشاکی شەرعی بپۆشێ و بە تەوبەکردن بگەڕێتەوە لای پەروەردگار و واز لەو تاوانانە بهێنێ کەکردوویەتی و پەڕەی کۆن بدڕێ و پەڕەیەکی نوێ هەڵبداتەوە, خوای گەورەش لێبووردەیە هەروەك ئەفەرموێ: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى ﴾ (طه_٨٢)..

واتە: دڵنیاش بن بەڕاستی من زۆر لێخۆش بووم لەو کەسەی کە توبە دەکات ، و باوەڕ دەهێنێت و کارو کردەوەی چاکە دەکات ، لەوەودوا (تا دوا هەناسەی ژیانی) بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ڕێبازە .

(٥) حیجاب بۆ ئافرەتان ئەو قەلاّ شورا بەرز و ئەستورەیە کەلە گورگەکانی سەردەم و دزی شەرەف و ناموس ئەیانپارێزیٚ, وەکو ئەو زلە توند و بەهێزەیە کەلەو پیاوانەی بدەی ئەیانەویٚ تیٚڕوانینی خاوەن حیجابەکە بدزن و وردە وردە بیخەنە داوی ژەهراوی خۆیان و پاکی و بێگەردی لیٚ بسێننەوە.

(٦) حیجاب وەکو ئەو چەند پەڵە هەورە ڕەش و تاریکەیە کە بارانی خێری و بەرەکەتی پیٚیە, گەر ئەو هەورە تەماویٚیە بەلاٚوەی لیٚکرد نەخێر و نەبارانیش نامێنن.

(٧) حیجاب جۆرێکە لە زمانەکانی گفتوگۆ کە لەڕێگەیەوە بە پیاوان ڕادەگەیەنیٚ کە هەڵگرەکەی پاك و بێگەردەو چەشنی ئەو ئافرەتانە نی یە کە ئەو دایناوە, وە حیجاب کەسایەتی ڕاستەقینەی هەڵگرەکەیمان بۆ ئەخاتەڕوو.

(٨) هۆکارێکە بۆ ڕزگاربوون لەو جوانیەیە دەست کردەی ئافرەتان کە لەڕێگەی بەکارهێنانی دەرمانی خۆجوانکردنەوە و مکیاج کردنەوە بەدەستی ئەهێنن.

(٩) حیجاب خاوەنەکەی دوور ئەخاتەوە لەکەوتنە نێو تاوان و بە هەڵەداچوون.

(١٠) حیجاب ئەو دەرگا ئەستورە داخراوەیە کەهیچ کەس ناتوانێت بیکاتەوە بەتایبەت لەکاتێکدا وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاری دابێتەوە کە ئەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الأحزاب_٥٩)

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیمانداران بڵێ کە بەپۆشاکی باڵاپۆش (واتا عابا) خۆیان داپۆشن, ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن کە ئەمانە بەحەیا و پاك و ڕەوشت بەرزن تاوەکو ئازار نەدرێن..

حیجاب کردن فەرمانێکە و پەروەردگار فەرمانی پێکردووە بۆیە ئافرەتی ئیماندار تەنها لەسەریەتی ملکەچی ئەو فەرمانەبێت, وەنابێ بەقسەی هیچ

**کەسێك بکات گەر هاتوو داوایان لێکرد لایبات با باوك و برا و مێردیش بێت چونکە** (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)- رواه أحمد والحاكم.

**واتە: گوێ ڕایەڵی بۆ هیچ کەسێ نیە ئەکەر لە سەرپێچی خوای پەروەردگاردا بێت .**

(١١) **حیجاب ئەو شۆڕشە بەتینەیە دژ بەو میللەتانەی بانگەواز ئەکەن بۆ ئازادکردنی ئافرەتان بۆ ئەوەی بەنیوە ڕووتی و سفورەوە لەماڵ دەرچن.**

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:** (صنفان من أهل النار لم أرهما: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات، رءوسهن كأسنمة البخت المائلة، لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها) رواه مسلم (٢٠٤٤) .

**واتە: مەبەست لە (کاسیات عاریات) ئەوەیە کە ئافرەتێك جلی لەبەردایە بەڵام هەموو لاشەی نەپۆشیوە بۆ نموونە جلێکی تەنك لەبەر بکات کە لەشی لێیەوە دیارە یان جلێکی کورت بێت کە بەشێك لە لاشەی بەدەر دەکەوێت, ئەمانەش لەو کەسانەن کە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنی بەهەشتیش ناکەن, (مەگەر دوای تۆبە کردن).**

(١٢) **حیجاب ووشەیەکی شیرینە, هەموو موسڵمانان بەبیستنی کەیف خۆش ئەبن چونکە حیجاب پارێزەری ئافرەتە و بەڵگەی پاکێتی و**

بەشەرمی‌یەتی لە هەمان کاتدا ئاسایش و جوانی‌یە, گوێڕایەڵی کردنە بۆ فەرمانەکانی پەروەردگار, هەروەك پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا...﴾ (الجاثية_١٨)

واتە: پاشان ئێمە تۆمان ئەی محمد (ﷺ) خستۆتە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوان لە هەموو کارو بارێکی ئەم ئایینەدا ، کەواتە شوێنی بکەوەو لێی لامەدە.

ئاشکرایە ئەو ئافرەتەی حیجاب ناکات تیری ژەهراوی ئاڕاستەی چواردەور ئەکات و بەشدار ئەبێت لەو تاوان و تێڕوانینانەی پیاوان ئەیکەن.

خوای گەورەش ئەفەرموێ: ﴿وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ﴾ (الأعراف_٢٦).

واتە: پۆشاکی تەقواو خواناسی چاکترو خێردارتر و بەفەڕترە.

لە کۆتایشدا هیوادارم ئەم بابەتە ببێتە هۆی هیدایەت دانی ئەو کچانەی کەم تەرخەمی ئەکەن سەبارەت بەو فەرمانەی پەروەردگار وپێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە ئەویش حیجاب کردنە.

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**باوکی فریشتە**